# پەنجا و پێنج ووتە لە ووتەکانم



نوسینی:
ئەسما حسێن

# ناسنامەی پەرتوک

ناوی کتێب : ٥٥ ووتە لە ووتەکانم

نوسینی : ئەسماء حسێن

دیزاینی بەرگ و ناوەوە : ڕێدار عومەر

تیراژ: ٥٠٠ دانە

# پێشەکی :

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سوپاس و ستایش بۆ خوایەك كەحەمد و سوپاسی خۆی کردۆتە کلیلەی پاکردنەوە، وەهۆی زیادکردنی نیعمەتەکانی و دەلیل لەسەر گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی.

سوپاس بۆ خوایەك کە بەبێ ئەوەی ببینرێت ناسراوە، وە دروستکەرێکی بێ وێنەیە بەدەسەڵاتی بەرزی خۆی هەموو بونەوەری دروست کردووە، وەهەموو دەسەڵات دارێك بەندەی خۆیەتی.

سوپاس بۆخودا یارمەتی دام لەدانانی ئەم نامیلکەیە و توانیم بیخەمە بەردەستی ئێوەی خوێنەری خۆشەویست،وە سوپاس بۆهەموو ئەوانەی کەیارمەتی دەرم بوونە بۆ کاری خێر و چاکە.

**ئەسماء حسێن**

**٢٠٢٢/١/٢٤**

## وتەی یەکەم :

ئیلاهی سەختییەکانی ژیانمان ،،،

بۆبکەرە توێشووی قیامەتمان،،،

## وتەی دووەم :

دەست بگرە بەدینەکەی خوا...

تا لە ڕزگاربووان بیت ...

## وتەی سێ یەم :

کەسێك مەکە پشتیوانی خۆت ...

کەتوانای پشتیوانی تۆی نەبێت ...

## وتەی چوارەم

زاڵم بزانە...

ئێمە.... خودامان هەیە



## وتەی پێنجەم :

دین و ڕەوشت بەیەکەوە جوانن...



## وتەی شەشەم :

ئەتوانی بەسەختترین ڕێگادابڕۆی و سەربکەوی...

بەڵام پێویستت بەکەسێکە دەستت بگرێ،

تاکو نەکەویت.



## وتەی حەوتەم :

هیوا بەكەسێ مەبەخشە... كە ناتوانیت،،،

ببیتە جێگای هیواو ئومێدی ئەوكەسە

## وتەی هەشتەم :

شەرم مەكە بەرامبەر نەیارانی دینەكەت.

سەربەرزبە و شانازی بكە بەدینەكەت!،،

چونكە ... تۆ خودات هەیە ...

نەیارانیش ... **شەیتان**...

كامیان بەهێزتر و تواناداترە ؟!.

## وتەی نۆیەم :

ئەی ئافرەت لەگەڵ پیاو بەشێوازێک بدوێ
شەرم و حەیات لەدەست نەدەیت.
ئەی پیاو لەگەڵ ئافرەت بەشێوازێک بدوێ
هێزی پیاوەتیت کەم نەکات.

## وتەی دەیەم :

ئاگاداربە ! هەموو شتێك شایەنی ئەوە نیە،،،

دڵی خۆتی بۆ تەنگ بکەی!

یان ...دڵتی پێ خۆش بکەیت.

## وتەی یازدە :

خەمەکانم نیشانی کەس نادەم،،،
چونکە کەس چارەی خەم ناکات،،
خەمەکانم بەرزدەکەمەوە بۆ ئاسمان،،
تەنها خودا لێم تێدەگات...
هەرخۆی چارەی خەمم دەکات.

## وتەی دوانزە :

لەناوەوە وێرانم بەڵام لەدەرەوە هەرگەش خۆم نیشان ئەدەم
چونکە کەس بەوەنازانێ لەناخی مندا هەیە اللەنەبێت بۆیە منیش
بۆکەسێکی نیشان نادەم کەنازانێ

## وتەی سیانزە :

نهێنی سەرکەوتنەکان ...پشت بەستنە بەخودا،،



## وتەی چواردە :

ڕەوشت تاکە شتێکە کڕین و فرۆشتنی لەسەر نییە،،

بەڵکو بەدەست دێت،،

ئەوانەی بوونە خاوەن ڕەوشت هەژارەکان بوون.

بۆیە بزانە گەورەترین سەرمایەی مرۆڤ بریتیە لەڕەووشت!



## وتەی پانزە :

ڕەوشت جوانی ئەوشتەیە،،،

زۆر کەس لێی بەهرەمەندنین!

## وتەی شانزە :

کەسانێك هەن شتەکانیان لاپێچەوانە بۆتەوە!

چاکەیان لاخراپە

خراپەیان لاچاکە

دوژمنیان لادۆستە و دۆستشیان لا دوژمنە!

ئەوانە کەسانێکن دین و خوایان پشتگوێ خستووە.

## وتەی حەڤدە :

دینی خوا بگەیەنە!

گوێ بەقسەی خەڵک مەدە،،،

مەگەر هیچ پێغەمبەرێک هەبوو ؟

لەلایەن گەلەکەوەیەوە ،

پێشوازیەکی شایستەی لێکرابێت؟

## وتەی هەژدە :

ئاگاداری شمشێرەکەت بە...زۆر مەیوەشێنە...

ڕەنگە ڕۆژانە دەرروونی چەندین کەسی پێ لەگۆڕ بنێیت..

ئەوشمشێرە مەترسیدارەش ( زمانە )

## وتەی نۆزدە:

**پیاو:**

لێبووردە نەبێ ....نیشانەی **دڵ** ڕەقییە.

زۆر توڕەبێ.....**بێدەسەڵاتییە.**

نەسڵەمین بوو...ترسناکە.

**خۆویست** بێ.... دەورووبەری لەدەست دەدات.

تۆ لەکامیانی ؟ **هەمووی** یان **دانەیەک** یان **هیچ**؟

## وتەی بیست :

لەسەردەمی ئێستادا هەتا **لەخەڵکی** دووربیت،،،

لە**خودا** نزیکیت!

## وتەی بیست و یەک :

سەیری ڕەحم و **میهری خودا**...

تۆیەکی لەبیرکراو کاتێ **دەستە بچووکەکانت** بەرز دەکەیتەوە ...

**خودا** بەبەتاڵی نایهێڵێتەوە و **پڕی** دەکات...

لە**لێبوردەیی** و **بەخشین** و **بەخشندەیی**.



## وتەی بیست و دوو :

ئیلاهی ئەوکاتە دڵ دەبێتە خاوەنی ئاسوودەیی
کاتێکە بەدیداری تۆ دەگات و ڕووی لەتۆیە و
پشتی لەهەموو خەڵك و جیهانە.



## وتەی بیست و سێ:

ئارامگرتن ،،هۆکارە بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانت.

## وتەی بیست و چوار:

ساڵێ ڕۆیی لەتەمەن
هەنگاوێ نزیک لەگۆڕ
سەیرم دێ ئەو خەڵکە بۆ ئاهەنگ دەگێڕن ؟!

## وتەی بیست و پێنج :

هۆکاری هەموو جوانییەکانت
تەنها ئیسلامە.

## وتەی بیست و شەش :

ڕێزی بەرامبەر بگرە و بیر لەڕەفتارەکانی بەرامبەر مەکەوە،،

چونکە زۆرجار بەرامبەرەکەت

وەکو خۆت هەڵس و کەوتت لەگەڵ دەکات.

## وتەی بیست و حەوت :

خودا ڕێزی لەمرۆڤ ناوە

تۆ چیت ؟

تا بێڕێزی بنوێنی بەرامبەر مرۆڤ؟

**وتەی بیست و هەشت :**

خۆت چاک بکە

ئینجا

دەست بە ئامۆژگاری بکە



**وتەی بیست ونۆ:**

ئەو هەوڵانە بەزایەناچن بۆ بەدەست هێنانی بەهەشت بێ،

هەوڵ بۆ دنیاو بەهەشت لێک جیابکەرەوە.



## وتەی سی :

هیچ شتێك ئەوەندەی ئەوە قورس نییە کەفەرموودەیەک ببیستی و پیاییدا تێپەڕی !!

بێئەوەی تەواو لەمانا ومەبەستی تێگەیشتبی ؟!

وەلەدڵیدا جێگیری نەکردبێت و نەچەسپابێت؟!



## وتەی سی و یەک :

ئیلاهی وامان لێبکە

ترس و خۆشەویستیمان تەنها لەتۆ و لەپێناو تۆبێ



**وتەی سی و دوو :**

**تۆ !!...**

بەجوانترین شێوە دروست کراویت

کێشەکە خۆتی کە خەڵکی ناشرین لێت دەڕوانن.

**وتەی سی و سێ :**

ئەزانی **هەوڵدان** واتاچی!

واتە بەدەست هێنانی **هەموو ئەوشتانەی**

**کەخۆشت ئەوێن** و ئەتەوێت پێیان بگەی!!

## وتەی سی و چوار:

هەموو کردەوەکان بەپێی نیەتن !

بۆیە هەر کردەوەیەکت ئەنجامدا نیەتی دڵت باش بکەو بۆخوا

ئەنجامی بدە!!

## وتەی سی و پێنج :

زۆر گەڕام بەدوای هاوڕێیەکی چاك!

بەڵام لەکۆتاییدا هەر گەڕامەوە لای قورئان!!!

چونکە دەرکەوت باشترین هاوڕێ تەنها قورئانە!!

## وتەی سی و شەش :

ژیان فێری کردم هەتا زیاتر بەدوای دنیادا ڕابکەی !

هەرگیز ناتوانی پێی بگەی !؟

بۆیە فریای قیامەتت بکەوە،چونکە بەرەو ڕووت دێت.

## وتەی سی و حەفت :

هەر کەسێك خوا نەناسێت !

ئەوا دڵنیابە هیچ ناناسێت!

## وتەی سی و هەشت :

ئەگەر لەدنیادا خودا نەناسی بەحەق ؟!

دەکەی هاوارو ڕۆڕۆ لەڕۆژی حیساب و حەق.

## وتەی سی و نۆ:

ئیسلام هەموو کەس قبوڵ دەکات....

بەڵام هەموو کەس ئیسلام قبوڵناکات.

## وتەی چل :

کوێر کەسێك نیە چاوی نابینێت؟!
بەڵکو کوێر کەسێکە ڕێگای ڕاستی ئیسلام نابینێت و شوێنی ناکەوێت

## وتەی چل و یەک :

ڕاسگۆبە...
دڵنیابە ڕزگار دەبیت.

## وتەی چل و دوو :

ئەگەر بزانی خودا ڕەقیبە ...
هەرگیز جورئەتی گوناحت نابێ!

## وتەی چل و سێ :

کەسێ تەقوای لەدڵدایە...

هەست بەبوونی خوابکات لەتەنهاییدا

## وتەی چل و چوار:

وتیان فلانەکەس ئاوا و ئەوایەو وایکرد

گوتم :

ئەوکەسەی ئاوا و ئاوای گوت لەو خراپ تری کرد!!

## وتەی چل و پێنج :

خۆشەویستیەک بناغەکەی ئیسلام بێت.

هەرگیز کۆتای نایەت.

## وتەی چل و شەش :

هەرکەسێ بۆ بەردەوام بوون لەگوناح بیانوو بهێنێتەوە...

منیش هەزاران قسە ئەهێنمەوە بۆ خۆپاراستن...

## وتەی چل و حەوت :

حەزم ئەکرد هەموو خەڵکی لەمن باشتر بوو نایە

تاکو منیش چاوم لێیان بکردایە

## وتەی چل و هەشت :

لەدونیادا هەموومان رێبواری رێی سەفەرین

رێگای خودابگرە !

بەرلەدەستپێکی سەفەرت

## وتەی چل و نۆ:

بیستوومە زۆری ئافرەتان دەڵێن پیاوان بێ تەعەمولن

منیش دەڵێم بەڕاستی زۆربەی ئافرەتان زیادەڕەوون!

## وتەی پەنجا :

مەرج نییە ئەندامەکانی جەستەت هەموو تەواوبن ئەوجا کەسێکی کامڵ بیت!

ئیمانەکەت تەواوبێ نیشانەیە ... بۆ کامڵیت.

## وتەی پەنجا ویەک :

تەنها موسڵمانیەتی گرنگ نیە

کردەوەی موسڵمانیەتیش گرنگە!!!

## وتەی پەنجا و دوو :

گرنگ نیە تۆکێی

گرنگ ئەوەیە بزانی خوات کێیە!

## وتەی پەنجا و سێ :

گرنگ نیە خەڵکی زۆر بناسیت

گرنگ ئەوەیە خودا بناسیت!

## وتەی پەنجا وچوار:

گرنگە چاکە بکەیت

گرنگتر ئەوەیە بۆخودای بکەیت!

## وتەی پەنجا و پێنج :

گوناح وتاوان لەسەردڵی ئیماندار وەک شاخ وایە

قورسو گرانە لەسەری



# کۆتایی :

لەکۆتاییدا داواکارم لەخوای پەروەردگار،ئەم ناميلكەيە ببێتە جێگای سوودی ئێوەی خۆشەویست وە بیکاتە توێشووی قیامەتمان.داواکارم لەخوای گەورە لێمان خۆشبێت لەهەر کەم و کورپیوهەڵەیەك کەهەمان بووبێت و ڕەحممان پێبکات وە داواکارم هەر یەکێك ئەم نامیلکە دەخوێنێتەوە لەدوعای خێر بێبەشمان نەکات خوای گەورە پاداشتی ئێوەش بداتەوە اللهم امين يارب.



هیوای سوود وەرگرتن بۆ هەموو لایەك





ئەسماء حسێن

دیزاین: ڕێدار عومەر

شەرم مەکە بەرامبەر نەیارانی دینەکەت.

سەربەرزبە و شانازی بکە بەدینەکەت!..

چونکە ... تۆ خودات هەیە ...

نەیارانیش ... شەیتان...

کامیان بەهێزتر و توانادارترە ؟!.




چاپی یەکەم